# هاوەڵان کێنە و
# چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین؟

ئامادەکردنی

خدر حەمەد خەتی

٢٠٢٠

# ناوەڕۆك


| لاپەڕە | سەرەباس |
|---|---|
| ٣ | پێناسەی هاوەڵ (الصحابة) |
| ٣ | هاوەڵان باشترین دڵیان هەبووە |
| ٤ | ژمارەی هاوەڵان |
| ٤ | ژمارەی ئەو هاوەڵانەی فەرموودەیان ڕیوایەت كردووە |
| ٧-٥ | پلە و پایەی هاوەڵان لە قورئانی پیرۆزدا |
| ١٠-٧ | پلە و پایەی هاوەڵان لە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) |
| ١٥-١١ | پێویستە ئەو هەڵسوكەوتانەمان بەرامبەر هاوەڵان هەبێ |

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى خَيْرِ خَلْقِهِ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ(ﷺ) (اَلْمَبوثِ رَحْمَةً لَلعالَمين) وَعلى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ والتَّابِعينَ لَهُمْ بِإحْسَانٍ إلى يَومِ الَّدِّين)

## پێناسەی هاوەڵ (الصحابة):

**هاوەڵ : ئەو موسڵمانەیە لە کاتی ئیسلامەتیدا پێغەمبەری (ﷺ) لە کاتی پێغەمبەرایەتی بە زیندوویی دیتبێ، یان پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی دیتبێ و بە موسڵمانیەتیش مردبێ، جا ئادمیزاد بێ یان جنۆکە.**

## هاوەڵان باشترین دڵیان هەبووە:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ إِنَّ اللَّهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ فَاصْطَفَاهُ لِنَفْسِهِ فَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ فَوَجَدَ قُلُوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ فَجَعَلَهُمْ وُزَرَاءَ نَبِيِّهِ يُقَاتِلُونَ عَلَى دِينِهِ فَمَا رَأَى الْمُسْلِمُونَ حَسَنًا فَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ حَسَنٌ وَمَا رَأَوْا سَيِّئًا فَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ سَيِّئٌ ( رواه احمد ) قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده حسن

**واتە: (عەبدوڵای کوڕی مەسعود) (خودا لێ ڕازی بێ) دەڵێ: خودای باڵا دەست تەماشای دڵی بەندەکانی کرد، بینی دڵی پێغەمبەر (ﷺ) باشترن دڵە، هەڵبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی، پەیامی خۆی پێ ڕەوانکرد، دواتر تەماشای دڵی بەندەکانی**

کرد له پاش دڵی پێغەمبەر (ﷺ) بینی دڵی هاوەڵانی باشترین دڵن، خودا کردنی به پاڵپشت بۆ پێغەمبەرەکەی ، دەجنگێن بۆ ئایینەکەی، ئەوەی موسڵمانان. پێیان باش بێ، ئەوە لای خودا باشە، ئەوەی پێیان خراپ بێ ، ئەوە لای خودا خراپە.

## ژمارەی هاوەڵان:

کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ژمارەی هاوەڵان بە پیاو و ئافرەتەوە (١٢٤٠٠٠) سەد و بیست و چوار هەزار کەس بوون.

## ژمارەی ئەو هاوەڵانەی فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە:

ئیمام (ئیبن صلاح) دەڵێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، ژمارەی ئەو هاوەڵانی گوێیان لە پێغەمبەر بووە و فەرموودەیان لێ ڕیوایەت کردووە(١١٤٠٠٠) سەد و چواردە هەزار کەس بوون .

# پلە و پایەی هاوەڵان لە قورئانی پیرۆزدا

هاوەڵان خودا لێیان ڕازی بێ لە پاش پێغەمبەران باشترین دروستکراوی خوان ، خودای گەورە مەدح و ستایشی هاوەڵان دەکا:

١-(مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا (الأحزاب:٢٣)

واتە: لەناو باوەڕداران دا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لە ئەو پەیمانەی کە دابویان بەخوا ئینجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو) هەندێکیشیان چاوەڕوانن هیچ گوڕانێکیان (لە بەڵێنی خۆیان دا) نەکردووە.(پوختەی تەفسیر)

٢-(رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ٣٧) النور

واتە: پیاوانێك کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناکات لەیادی خواو نوێژ کردن و زەکات دان لە ڕۆژێك دەترسن (ڕۆژی قیامەت) دڵ و چاوەکان تیایدا (دەگۆڕێن و) ئاوە ژوو دەبن. (پوختەی تەفسیر)



٣-(وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (التوبة:١٠٠)

واتە: وە پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و یاریدەدەران ئەوانەش زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون خوا لێیان ڕازییە ئەوانیش لەخوا ڕازین وە (خوا) بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە.(پوختەی تەفسیر)

٤-(مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (الفتح:٢٩)

واتە: موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوایە ئەو (باوەڕدار) انەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین دەیان بینی (هەمیشە) لە کوڕنوش و سوژدە بردن داوای بەهرەو ڕەزامەندی خودا دەکەن نیشانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سوژدە بردن (یانەوە) ئەوە

نموونەیانە لە تەوراتدا ئەوە نموونەشیان لە ئینجیلدا وەك كشتوكاڵێك وایە چەكەرەی دەركردبێ (سەوز بووبێ) ئینجا چەكەرەكەی بەهێز كردبێ و قاییم بووبێ جا لەسەر لاسكی خۆی ڕێك وەستابێ (ئەوەندە جوان بێ) جوتیارەكانی سەرسام كردبێ تا بە (زۆر بوونی) هەوەڵانی داخ و مەراق بدا بە كافران خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان كە باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاكەیان كردووە بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (كە بەهەشت) ە.(پوختەی تەفسیر)

٥-(رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ) (التوبة) (١٠٠)

واتە: خودا لێیان ڕازی بووەو ئەوانیش لەو ڕازی بوون.

٦-(وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰ) الحديد (١٠)

واتە: خوا بەڵێنی بەهەشتی بەهەموویان داوە.

## پلە و پایەی هاوەڵان لە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ)

### ١- هاوەڵان باشترین دروستكراوی خودان:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ سُئِلَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ قَالَ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ...) رواه البخاري

واتە: (عەبدوڵای كوڕی مەسعود) (خوای لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر كرا (ﷺ) باشترین خەڵكی كێنە؟ فەرمووی: خەڵكی سەردەمی من، پاشان دوای ئەوان، پاشان دوای ئەوان ..)

## ٢- هاوەڵان ئەمانن بۆ ئوممەت:

(عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ. قَالَ: فَجَلَسْنَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ: (مَا زِلْتُمْ هَاهُنَا). قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ قُلْنَا نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ. قَالَ: (أَحْسَنْتُمْ) أَوْ (أَصَبْتُمْ). قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، وَكَانَ كَثِيرًا مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: (النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ. وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ. وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ) رواه مسلم

واتە: (ئەبو بوردە)لە باوکیەوە، دەڵێ: نوێژی مەغریبمان کرد لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)، لەدواییدا وتمان: خۆزگە دانیشتایەین تا عیشایشمان لەگەڵ دەکرد، دانیشتین، هاتە ناومان و فەرمووی: (هێشتا لێرەماون؟) وتمان: (یا رسول الله) نوێژی مەغریبمان لەگەڵ کردی، وتمان: دادەنیشین هەتا نوێژی عیشایش دەکەین، فەرمووی: (چاکتان کرد) یان (پێکاتان) دەڵێ: سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان زۆر جاریش ئاوا سەری بەرز دەکردەوە- فەرمووی: (ئەستێرەکان سەلامەتین بۆ ئاسمان، هەرکات ئەستێرەکان نەمان ئاسمان توشی ئەو کارەساتە دێت کە وادەی پێدراوە، من سەلامەتیم بۆ ئوممەتم، هەرکات ڕۆیشتم یارەکانم توشی ئەوکارەساتە دێن کە وادەیان پێدراوە، یارەکانم سەلامەتین بۆ ئوممەتم، هەرکات یارانم نەمان، ئوممەتم تووشی ئەوکارەساتە دەبێت کە وادەی پێدراوە.

## ٣- پێویستە ڕێز لە هاوەڵان بکرێن:

(عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ) : (أَكْرِمُوا أَصْحَابِي فَإِنَّهُمْ خِيَارُكُمْ) رواه النسائي صحيح

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ڕێز لە هاوەڵانی من بکرن، چونکە ئەوان باشترینی ئێوەن.**

## ٤- ئەوەی جنێویان پێ بدات نەفرەت لێکراوە:

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ) رواه الطبراني قال الالباني صحيح

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خودا لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەوەی جنێو بە هاوەڵانی من بدات ، لەعنەتی خودا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێ.**

## ٥- تاکو نزیکتربین لە هاوەڵان لە خێر نزیکترین:

(عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ أَسْقَعَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : (لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَنِي، وَاللَّهِ لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَ مَنْ صَاحَبَنِي، وَاللَّهِ لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَأَى مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَنِي) أخرجه أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف قال الالباني صحيح في السلسلة الصحيحة

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقع دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەێشتا ئێوە لەسەر خێرن ، مادام ئەو کەسانەتان لە ناون کە منی بینیوە و هاوەڵەتی منی کردووە، سوێند بەخوا هێشتا لەسەر خێرن مادام ئەوانەتان لە ناودایە کە ئەوانەیان بینیوە کە منیان بینیوە و هاوەڵەتی هاوەڵانی منیان کردووە، سوێند بە خوا هێشتا لەسەر خێرن، مادام لەناوتاندا هەیە، ئەوەی کەسێکی دیوە، ئەو کەسەش ئەو کەسەی دیوە کە منی دیوە و هاوەڵەتی کەسێکی کردووە، ئەو کەسەش هاوەڵەتی ئەو کەسەی کردووە کە هاوەڵەتی منی کردووە.

## ٦– هاوەڵان شایەدی خودان لەسەر زەوی:

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) (وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ). وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) (وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ). قَالَ عُمَرُ: فِدًى لَكَ أَبِي وَأُمِّي، مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرٌ، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ. وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرٌّ، فَقُلْتَ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) (مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ. أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ) متفق عليه

واتە: (ئەنەسی کوڕی مالیك) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: جەنازەیەك برا (ئیمانداران) بەباشی ناویان هێنا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو)، جەنازەیەکی تریشیان برد (ئیمانداران) بەباشی ناویان نەهێنا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر

بوو) (عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: دایك و باوكم بەقوربانت بێت: جەنازەیەك براو بەباشی ناوی برا فەرمووت: مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. جەنازەیەكی تر هێنرا بە خراپی ناوی برا، فەرموت: مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی ئێوە بەچاكی ناوی ببەن ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە، ئەوەش وەسفی بەخراپە دەكەن، ئەوە دۆزەخی بۆ مسۆگەرە، ئێوە شایەتی خوای گەورەن لە زەویدا).

## پێویستە ئەو هەڵسوكەوتانەمان بەرامبەر هاوەلان هەبێ

### ١- پێویستە خۆشمان بوێن:

خۆشەویستنی هاوەڵان نیشانەی ئیمانە، ڕەق لێ بونەوەیان نیشانەی نیفاقە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی( نیشانەی ئیمان خۆشویستنی ئەنصارەكانە، نیشانەی دوو ڕووی بوغزاندنی ئەنصارەكانە، جا ئەگەر بۆ ئەنصارەكان ئاوا بێ، ئەبێ بۆ موهاجیرین چۆن بێ ، چونكە ئەوان لە پێشترن لە موسڵمان بوو و كۆچكردن.

### ٢- پێویستە بزانین ئەوان باشترین كەسن:

خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ..... ﴾(آل‌عمران:١١٠)

واتە: ئێوە(موسوڵمانان) باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵكی هێنرابێتە دی فەرمان دەدەن بەچاکە وە جڵەوگیری دەکەن لە خراپە.

## ٣-پێویستە بکرێنە پێشەنگ:

(ئبن مەسعود) جوانی فەرمووە: (وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - قَالَ: مَنْ كَانَ مُسْتَنًّا ؛ فَلْيَسْتَنَّ بِمَنْ قَدْ مَاتَ فَإِنَّ الْحَيَّ لَا تُؤْمَنُ عَلَيْهِ الْفِتْنَةُ، أُولَئِكَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) كَانُوا أَفْضَلَ هَذِهِ الْأُمَّةِ، أَبَرَّهَا قُلُوبًا وَأَعْمَقَهَا عِلْمًا، وَأَقَلَّهَا تَكَلُّفًا اخْتَارَهُمُ اللَّهُ لِصُحْبَةِ نَبِيِّهِ، وَلِإِقَامَةِ دِينِهِ، فَاعْرِفُوا لَهُمْ فَضْلَهُمْ، وَاتَّبِعُوهُمْ عَلَى آثَارِهِمْ، وَتَمَسَّكُوا بِمَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ أَخْلَاقِهِمْ وَسِيَرِهِمْ، فَإِنَّهُمْ كَانُوا عَلَى الْهَدْيِ الْمُسْتَقِيمِ) رَوَاهُ رَزِينٌ) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح المؤلف: علي بن (سلطان) محمد، أبو الحسن

واتە: (ئبن مەسعود) دەڵێ: ئەوەی شوێنکەوتەی کەسێك بێ، با شوێنکەوتەی مردوان بێ، چونکە ئەمانەت نیە زیندوان تووشی ئاشووب نەبن، هاوەڵانی (محمد) (ﷺ) باشترینی ئەو ئوممەتن، باشترین دڵیان هەبوو، قوڵترین زانستیان هەبوو، زەحمەتیان لەسەر خەڵکی نەبوو، خودا بۆ هاوڕێیەتی پێغەمبەر هەڵبژاردوون، بۆ ڕاگرتنی ئایینەکەی، ئێوەش قەدریان بزانن و بیانناسن، بە دوای

کردەوەکانیان بکەون، ئەوەی پێتان دەکرێ دەست بگرن بە ڕەوشتەیان و ژیاننامەیان، چونکە ئەوان لەسەر هیدایەتی راستەقینەن.

## ٤- پێویستە دوعایان بۆ بکەین و بۆیان داوای ڕەزامەندی خودا بکەین:

چونکە ئەم ئایەتە فێرمان دەکات دوعا بۆ هەموو موسڵمانان بکەین:

(وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ (الحشر:١٠)

واتە: ئەوانەش لەپاش ئەمانەوە هاتوون ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان خۆش ببە لە ئێمە وە لەو برایانەشمان (خۆشببە) کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێناندا وە هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرتۆی دڵسۆزی میهرەبانی.

وە لەکاتی ناوهێنانیان بڵێن (خودا لێیان ڕازی بێ).

## ٥- پێویستە زمانمان بپارێزن لەو کێشانەی هەیان بووە:

ئەوان ئیجتهادیان کردووە، ئەگەر پێکاویانە دوو پاداشتیان بۆ هەیە، ئەگەر نەیان پێکاوە یەك پاداشتیان بۆ هەیە.وەك لەم دەقەدا هاتووە

(عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضي الله عنه): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ (ﷺ) يقول: (إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ) رواه مسلم

**واته: (عەمر)ی کوڕی (عاص)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: (ئەگەر دادوەر دادگایی کرد وتێکۆشا (بۆ دۆزینەوەی ڕاستی) پاشان پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر دادگایی کردو تێکۆشا و پاشان هەڵەی کرد ئەوە یەك پاداشتی بۆ هەیە).**

## ٦-نابێ جوێنیان پێبدرێ:

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:**

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) (لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي. فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ) متفق عليه

واتە: (ئەبو هورەیرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (جنێو مەدەن بەیارانی من، جنێو مەدەن بەیارانی من، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە گەریەکێ لە ئێوە **بەئەندازەی کێوی (ئوحد) ئاڵتون بکات بەخێر، ناگات بە مشتییەکێ لەوان و، بەنیوەی مشتێکیش).**

## ٧- پێویستە بەرگریان لێبکەین:

دەربارەی بەرگری کردن لە موسڵمانان کە ئاگای لێ نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(عَن أسماءَ بنتِ يزيد قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (مَنْ ذَبَّ عَنْ لَحْمِ أَخِيهِ بِالْمَغِيبَةِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُعْتِقَهُ مِنَ النَّارِ) رَوَاهُ الْبَيْهَقِيّ و أحمد بإسناد حسن وابن أبي الدنيا والطبراني وغيرهم قال الالباني صحيح لغيره

واتە: (ئەسمای کچی یەزید) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی( هەرکەسێ بەرگری لە برایەکی خۆی بکا لە پاشەملە، خودای گەورە وەکو مافێك دایناوە لەسەر خۆی ئەو کەسە بپارێزی لە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر بۆ موسڵمانێکی سادە ئەو پاداشتەی هەبێ، بێگومان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتریش.

## لە کۆتاییدا:

با بڕیار بدەین دەست بکەین بە خوێندنەوەی ژیان و بەسەرهاتی هاوەڵان خودا لێیان ڕازی بێ، چونکە ئەوان خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر بوون، ژیانیش لەگەڵ ئەوان عیبادەتە.

کوردستان _ هەولێر_ گەڕەکی ئاری_ مزگەوتی عوزێری(٢٠٢٠/١٢/١٤) بە هیوای دوعای خێر لە بەڕێزتان.

(رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ) ئامین

الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ